چیرۆکی پێغەمبەران

# چیرۆکی حەزرەتی یوسف

## (سڵاوی خوای لێبێت)

5

نووسەر : کەمال سەید

وەرگێڕانی : ئازاد عەبباس گڵێجاڵی




وێنە : حەسەنێین و تەیبە عەبدوڵڵا

ناوی کتێب: چیرۆکی حەزرەتی یوسف(سڵاوی خوای لێبێت)
ناوی نووسەر: کەمال سەید
وەرگێڕانی: ئازاد عەبباس گڵێجاڵی
وێنە: حەسەنێین و تەیبە عەبدوڵڵا
نۆبەتی چاپ: دووەم/2022
چاپ: ناوەندی ڕێنوێن
تیراژ: 1000 دانە
ژپنک (ISBN): 978-9922-626-65-9
ژمارەی سپاردن: لە بەڕێوەبەرایەتیی گشتیی کتێبخانە گشتییەکان ژمارە (1331)ــی ساڵی (2018)ــی پێ دراوە.





**ناوەندی ڕێنوێن**

 07701932749 - 07501269689

 hakem1423@yahoo.com
renwen2009@yahoo.com

 سلێمانی - بازاڕی ئاوباریک - نهۆمی یەکەم
بەرامبەر کاسۆمۆڵ - دوکانی ژمارە (٦٦)



چیرۆکی پێغەمبەران

# چیرۆکی حەزرەتی یوسف
## (سڵاوی خوای لێبێت)

نووسەر : کەمال سەید
وەرگێڕانی: ئازاد عەبباس گڵێجاڵی
وێنە: حەسەنێین و تەیبە عەبدوڵڵا

5

## یوسف پێغەمبەر(سڵاوی خوای لێبێت)

حەزرەتی یەعقوب(سڵاوی خوای لێبێت) زۆر یوسف(سڵاوی خوای لێبێت)ی کوڕی خۆش دەویست..

شەوێک یوسف(سڵاوی خوای لێبێت) خەونی بینی.. لە خەونەکەیدا یانزە ئەستێرە و خۆر و مانگ هەموویان سەجدەیان بۆ دەبرد..

ئەم خەونە دڵی حەزرەتی ڕووناک کردەوە.. لە ناخەوە هەژاندی.. بۆ لێکدانەوەی ئەو خەونە بە پەرۆش بوو.. بۆیە ڕۆیشتە خزمەت باوکی و پێی فەرموو: ﴿يا أَبَتِ إِنِّي رَأَيْتُ أَحَدَ عَشَرَ كَوْكَباً وَ الشَّمْسَ وَ الْقَمَرَ رَأَيْتُهُمْ لي ساجِدينَ﴾ یوسف: ٤ واتە: باوکی بەڕێزم بێگومان من لە خەونمدا یازدە ئەستێرە و خۆر و مانگم بینی سوژدەیان بۆ دەبردم.

حەزرەتی یەعقوب(سڵاوی خوای لێبێت) جوان گوێی بۆ یوسف(سڵاوی خوای لێبێت)ی کوڕی گرت.. زانی کە یوسف(سڵاوی خوای لێبێت) پاشەڕۆژێکی گەشی هەیە.. بۆیە ئامۆژگاری کرد و پێی فەرموو: ﴿يا بُنَيَّ لاتَقْصُصْ رُؤْياكَ عَلى إِخْوَتِكَ فَيَكيدُوا لَكَ كَيْداً إِنَّ الشَّيْطانَ لِلإِنْسانِ عَدُوٌّ مُبينٌ﴾ یوسف: ٥ واتە: ڕۆڵە گیان خەونەکەت بۆ براکانت مەگێڕەوە، نەوەکو بەهۆی ئەوەوە فێڵێکت لێبکەن و تووشی بەڵایەکت بکەن (چونکە ئەم خەونە داهاتوویەکی بڵند بۆ تۆ دەگەیەنێت، ئەوانیش حەسوودیت پێدەبەن) بەڕاستی شەیتانیش دوژمنێکی ئاشکرای ئادەمیزادە.

ئەوەشی پێ فەرموو: کوڕی خۆم! خوای گەورە فێری خەوپەرژین و لێکدانەوەی خەونت دەکات.. فەڕ و بەرکەت دەڕژێنێ بەسەرتدا وەک چۆن فەڕ و بەرەکەتی ڕژاندووە بەسەر باوک و باپیر و باپیرە گەورەتدا..

## پیلانگێڕیی

حەزرەتی یوسف(سڵاوی خوای لێبێت) دە برای باوکی و یەک برای باوک و دایکی هەبوو.. ئەو دە برایەی کە لە باوکەوە برای بوون ئێرەییان پێ دەبرد.. بە ڕواڵەت و لەبەر چاوی باوکیان وایان پیشان دەدا کە ئەوان یوسف(سڵاوی خوای لێبێت)یان خۆش دەوێت..

یاری کردن و گەپ و گاڵتەکردن لەو دەر و دەشتەشیان لای یوسف(سڵاوی خوای لێبێت) خۆشەویست کردبوو بۆ ئەوەی لەگەڵیان بچێتە دەرەوە..

حەزرەتی یوسف(سڵاوی خوای لێبێت) نەوجەوانێکی دڵپاک و بێتاوان بوو.. بۆیە بڕوای بە براکانی کرد..

براکان هاتنە خزمەت باوکیان و وتیان: ﴿يا أَبانا ما لَكَ لاتَأْمَنّا عَلى يُوسُفَ وَ إِنّا لَهُ لَناصِحُونَ * أَرْسِلْهُ مَعَنا غَداً يَرْتَعْ وَ يَلْعَبْ وَ إِنّا لَهُ لَحافِظُونَ﴾ یوسف: ١١-١٢



واتە: ئەی باوکە ئەوە چیتە لە ئێمە دڵنیانیت لە بارەی یوسف(سڵاوی خوای لێبێت)ـەوە، بەڕاستی ئێمە زۆر دڵسۆزی ئەوین و زۆر خۆشمان دەوێت... بەیانی بینێرە لەگەڵمان با بای باڵی بدات، گەمە و یاری بکات و بێگومان زۆر پارێزگاری لێ دەکەین و ئاگامان لێی دەبێت.

حەزرەتی یەعقوب(سڵاوی خوای لێبێت) بە دڵێکی پڕ لە خەفەتەوە فەرمووی: ﴿لَيَحْزُنُنِي أَنْ تَذْهَبُوا بِهِ وَ أَخافُ أَنْ يَأْكُلَهُ الذِّئْبُ وَ أَنْتُمْ عَنْهُ غافِلُونَ﴾ یوسف: ١٣ واتە: من زۆر غەم و پەژارە دەمگرێت لەوەی ئێوە ببیەن، دەترسم گورگ بیخوات، لەکاتێکدا ئێوە لێی بێئاگان (لەبەر یاری و گەمەی خۆتان).

هەر دە کورەکەی حەزرەتی یەعقوب(سڵاوی خوای لێبێت) پێکەوە وتیان: ﴿لَئِنْ أَكَلَهُ الذِّئْبُ وَ نَحْنُ عُصْبَةٌ إِنّا إِذاً لَخاسِرُونَ﴾ یوسف: ١٤ واتە: سوێند بە خوا ئەگەر بێت و یوسف(سڵاوی خوای لێبێت) گورگ بیخوات، لەکاتێکدا ئێمەش کۆمەڵێکی بەهێزین، بەڕاستی ئەوکاتە ئێمە خەسارەتمەندین (زەرەرمان لە خۆمان داوە و شەرمەزاری لای تۆ دەبین).

## گورگ لە پێستی مرۆڤدا

خۆرێکی تازە هەڵات.. هەر دە براکە پێکەوە ڕۆیشتنە دەرەوە و یوسف(سڵاوی خوای لێبێت)یشیان لەگەڵ خۆیاندا برد.. یوسف(سڵاوی خوای لێبێت) بە دڵێکی پاک و پڕ لە خۆشەویستییەوە لەگەڵ ئەواندا ڕۆیشت.. ئەوانیش دڵیان پڕ بوو لە ڕق و کینە.. هەمووان ئێرەییان پێ دەبرد..

کاتێ گەیشتنە ناو جەرگەی سارای چۆڵ و هۆڵ و دووره دەست، بزەی سەر لێوی هەر دە براکە نەما و بوو بە ڕق و کینە.. ئەوان لەو کاتەدا وەک گورگ وابوون لە پێستی مرۆڤدا.. یەکێکیان هەتا خوا هێزی پێدابوو زللەیەکی لە یوسف(سڵاوی خوای لێبێت) دا و قیڕاندی و وتی: زووبە کوڕی ڕاحیل (دایکی حەزرەتی یوسف(سڵاوی خوای لێبێت) ناوی ڕاحیل بوو)..

حەزرەتی یوسف(سڵاوی خوای لێبێت) پەشۆکا.. تەماشایەکی براکانی کرد.. سەرەتا وایزانی یاری لەگەڵدا دەکەن.. بەڵام ئاگری ڕق و کینە و شەڕ لە چاویانەوە دیار بوو..

یەکێکی تر لە براکانی پاڵێکی بەهێزی نا بە یوسف(سڵاوی خوای لێبێت)ـەوە.. یوسف(سڵاوی خوای لێبێت) وتی: کاکە شەمعون بۆ وام لێ دەکەیت؟.. من براتم!..

حەزرەتی یوسف(سڵاوی خوای لێبێت) دەستیکرد بە گریان.. بە قوڕگێکی پڕ لە گریانەوە وتی: من یوسف(سڵاوی خوای لێبێت)ی براتانم!..

چاوی براکان بریسکەی تاوانی لێ هەڵدەسایەوە.. یەکێکیان خەنجەرەکەی هەڵکێشا.. یوسف(سڵاوی خوای لێبێت) لە ترسا ویستی ڕابکات.. بەڵام لە دواوە گرتی..

یەکێکی تر لە براکان وتی: با بیبەین بۆ شوێنێکی زۆر دووره دەست، لەوێ گورگ دەیخوات!..

شەمعون وتی: باش گوێ بگرن! من دەڵێم با بیبەین بۆ سەر ڕێگای کاروانییەکان و لەوێ فڕێی بدەینە نێو بیرێکەوە..

یوسف(سڵاوی خوای لێبێت)یان برد بۆ سەر ڕێگای کاروانچییەکان.. یەهودا زۆر بێ بەزەییانە کراسەکەی یوسف(سڵاوی خوای لێبێت)ی لە بەری یوسف(سڵاوی خوای لێبێت) کردەوە.. دوایی یوسف(سڵاوی خوای لێبێت)یان فڕێ دایە نێو بیرەکەوە..

یوسف(سڵاوی خوای لێبێت) گوێی لێبوو براکان دەیانگوت: دوایی لەم کارەمان پەشیمان دەبینەوە و داوای لێبووردن لە خوا دەکەین و خوا لێمان خۆش دەبێت!..

## لە نێو قوڵایی بیردا

یوسف(سڵاوی خوای لێبێت) کەوتە نێو قوڵایی بیرەوە.. لە بنی بیرەکەوە بانگی براکانی کرد.. شەمعون!.. لاوی!.. بەڵام کەس وەڵامی نەدایەوە.. یوسف(سڵاوی خوای لێبێت) لە نێو بیرەکەوە تەماشای ئاسمانی شینی دەکرد.. هەستی دەکرد دڵی پڕ بووە لە نوور و فەڕ و بەرەکەتی خودایی..

خۆر ئاوا بوو.. ڕۆژ بوو بە ئێوارە.. ئاسمان تاریک داهات.. یوسف(سڵاوی خوای لێبێت) لە تاو خەم و خەفەت دەستی کرد بە گریان.. لەولاشەوە براکانی بیریان لەوە دەکردەوە کە چی بە باوکیان بڵێن؟.. چۆن بە باوکیان بسەلمێنن کە یوسف(سڵاوی خوای لێبێت) نەماوە و ئەوانیش بێتاوانن؟..

هەمووان لەسەر ئەوە ڕێکەوتن کە بڵێن: گورگێک یوسف(سڵاوی خوای لێبێت)ی ڕفاندوە و خواردوویەتی!..

ئێوارەدرەنگانێک هەموویان ڕۆشتنەوە بۆ لای باوکیان و دەستیان کرد بە گریانی درۆ.. بە باوکیان وت: ﴿يا أَبانا إِنّا ذَهَبْنا نَسْتَبِقُ وَ تَرَكْنا يُوسُفَ عِنْدَ مَتاعِنا فَأَكَلَهُ الذِّئْبُ﴾ یوسف: ١٧ واتە: ئەی باوکی بەڕێزمان: بەڕاستی ئێمە ڕۆشتین پێشبڕکێمان دەکرد و یوسف(سڵاوی خوای لێبێت)مان لای کەلوپەلەکەمان بەجێ هێشت، ئەوسا گورگەکە پەلاماری داو خواردی.

دوایی کراسە خوێناوییەکەی یوسف(سڵاوی خوای لێبێت)یان دا بە باوکیان.. ئەوان پێشتر بەرانێکیان سەر بڕیبوو.. بە خوێنی بەرانەکە کراسەکەی یوسف(سڵاوی خوای لێبێت)یان خوێناوی کردبوو..

حەزرەتی یەعقوب(سڵاوی خوای لێبێت) هەستیکرد کە بە ڕواڵەت کوڕەکانی هەموویان دەگرین، بەڵام هیچیان فرمێسک لە چاویان نایەتە خوارەوە.. بۆیە فەرمووی: ﴿بَلْ سَوَّلَتْ لَكُمْ أَنْفُسُكُمْ أَمْراً فَصَبْرٌ جَمِيلٌ وَ اللّهُ الْمُسْتَعانُ عَلى ما تَصِفُونَ﴾ یوسف: ١٨ واتە: نەخێر وانییە، بەڵکو خۆتان بۆ خۆتان ئەم کارەتان سازداوە، جا چارم تەنها خۆگریی و ئارام گرتنە بەجوانترین شێوە، هەر خواش داوای کۆمەکی لێدەکرێت لەسەر ئەو باسەی ئێوە دەیکەن.

حەزرەتی یەعقوب(سڵاوی خوای لێبێت) تەماشای کراسەکەی کرد.. لێی ورد بوویەوە.. دوایی فەرمووی: چۆن گورگ یوسف(سڵاوی خوای لێبێت)ی خواردووە کەچی کراسەکەی نەدڕاوە؟.. بۆ جێگە کەڵبەی گورگ بە کراسەکەوە دیار نییە؟!..

حەزرەتی یەعقوب(سڵاوی خوای لێبێت) دەستیکرد بە گریان بۆ یوسف(سڵاوی خوای لێبێت)ی کوڕی.. هەموو ڕۆژێک بەردەوام دەگریا..

## کاروان

لە ڕۆژی چوارەمدا حەزرەتی یوسف(سڵاوی خوای لێبێت) گوێی لە دەنگی هەندێ پیاو بوو.. ئەوانە کاروانچی بوون.. خەریکی بازرگانی بوون و کەلوپەل و باریان بۆ وڵاتی میسر دەبرد.. کاروانەکە لە نزیک بیرەکە وەستان.. یەکێک لە پیاوەکان هاتە لای بیرەکە بۆ ئەوەی هەندێ ئاو هەڵگۆزێ و بیبا بۆ خواردنەوە.. پیاوەکە دۆڵچەکەی بۆ ناو بیرەکە شۆڕ کردەوە.. دوایی هەڵیکێشایەوە بۆ سەرەوە..

پیاوەکە وای دەزانی کە دۆڵچەکەی پڕە لە ئاو.. بەڵام کە هاتە سەرەوە دەبینێ کوڕێکی زۆر جوانی تیایە تەمەنی نزیکەی هەشت نۆ ساڵێک دەبێ!..

یوسف(سڵاوی خوای لێبێت) لە بیرەکە هاتە دەرەوە.. دەتگوت دوڕ و مرواری بریسکەدارە و لە نێو دەریا دێتە دەرەوە..

پیاوەکە هاواری کرد و وتی: مزگێنیم بدەنێ!.. ئەمە لاوێکی زۆر جوانە!..

ئەو کاتە هەرکەسێک منداڵێکی بدۆزیایەتەوە دەیکردە کۆیلە و لە بازاڕ بە پارەیەکی باش دەیفرۆشت.. بۆیە کاروانییەکان یوسف(سڵاوی خوای لێبێت)یان لە گەڵ خۆیان برد بۆ ئەوەی لە میسر وەکو کۆیلە بیفرۆشن و پارەیەکیان دەست بکەوێت..

لە میسر، عەزیزی میسر بوو بە کڕیاری یوسف(سڵاوی خوای لێبێت).. لە گەڵ خۆیدا بردییەوە بۆ نێو کۆشک.. بە زولەیخای ژنی خۆی گوت: ﴿أَكْرِمِي مَثْوَاهُ عَسَى أَنْ يَنْفَعَنَا أَوْ نَتَّخِذَهُ وَلَدًا﴾ یوسف: ٢١ واتە: ڕێز لەم لاوە بگرە، بە ئومێدی ئەوەی سودێکمان پێ بگەیەنێت، یان بیکەین بە کوڕی خۆمان.



## تاقیکردنەوە

یوسف(سڵاوی خوای لێبێت) وردە وردە گەورە دەبوو.. بوو بە لاوێکی زۆر شۆخ و شەنگ و زۆر بەڕێز و ژیر و دانا.. هەموو خوو و ڕەوشتێکی باشی تێدا بوو.. کاتێ گەیشتە تەمەنی گەورەبوون دڵی پڕبوو لە ڕاستی و بیروباوەڕ و خواناسی.. یوسف(سڵاوی خوای لێبێت) مرۆڤێکی زۆر پاک و چاک بوو... بۆیە هەرکەسێ یوسف(سڵاوی خوای لێبێت)ی ناسیبا، بە دەست خۆی نەبوو زۆری خۆش دەویست...

خانمی یەکەمی کۆشک، یوسف(سڵاوی خوای لێبێت)ی خۆش دەویست.. بەڵام ئەو دڵی لە دڵە پاک و ڕەوشتە بەرز و جوانەکانی یوسف(سڵاوی خوای لێبێت) نەچووبوو.. بەڵکو شەیدای سیما و شێوەی زۆر جوانی یوسف(سڵاوی خوای لێبێت) ببوو.. ئەو ئەویندارى ڕواڵەت بوو.. کاری بەسەر ناخەوە نەبوو.. بۆیە تووشی هەڵە بوو..

ڕۆژێک خاتوو زولەیخا و یوسف(سڵاوی خوای لێبێت)ی شۆخ و شەنگ بە تەنیا لە نێو کۆشک مانەوە.. زولەیخا بە چاوی پیسەوە لە حەزرەتی یوسف(سڵاوی خوای لێبێت)ی ڕوانی.. بۆیە: ﴿وَ راوَدَتْهُ الَّتي هُوَ في بَيْتِها عَنْ نَفْسِهِ وَ غَلَّقَتِ الأَبْوابَ وَ قالَتْ هَيْتَ لَكَ﴾ یوسف: ٢٣ واتە: جا ئەو ئافرەتەی کە یوسف(سڵاوی خوای لێبێت) لەماڵیدا بوو، هەوڵیدا یوسف(سڵاوی خوای لێبێت) لە خشتە ببات و دڵی ڕابکێشێت بۆ لای خۆی، هەموو دەرگاکانیشی داخست و وتی: وەرە پێشەوە و خۆت ئامادە بکە.

حەزرەتی یوسف(سڵاوی خوای لێبێت) فەرمووی: ﴿مَعاذَ اللّهِ إِنَّهُ رَبّي أَحْسَنَ مَثْوايَ إِنَّهُ لايُفْلِحُ الظّالِمُونَ﴾ یوسف: ٢٣ واتە: ئەی پەنا بە خوا، ئەو ئاغامە، قەدری گرتووم (بێ ئەمەکانی داوێن پیس) کە ناهەقن، ڕزگار نابن.

یوسف(سڵاوی خوای لێبێت) بەرەو دەرگای کۆشک هەڵات.. زولەیخا لە دواوە کراسەکەی گرت.. کراسەکەی دڕا.. بە ئیزنی خوای گەورە دەرگاکان خۆیان کرانەوە.. کاتێ یوسف(سڵاوی خوای لێبێت) گەیشتە بەر دەرگای کۆتایی ڕووبەڕووی مێردەکەی زولەیخا بوویەوە.. زولەیخا زۆر بە پیسی هاواری کرد و وتی: ﴿ما جَزاءُ مَنْ أَرادَ بِأَهْلِكَ سُوءاً إِلاّ أَنْ يُسْجَنَ أَوْ عَذابٌ أَليمٌ﴾ یوسف: ٢٥ واتە: باشە ئاخۆ سزای ئەو کەسە چییە کە ویستبێتی خراپە لەگەڵ خێزانەکەتدا بکات، جگە لەوەی زیندانی بکرێت یان سزایەکی بەئێش بدرێت.

یوسف(سڵاوی خوای لێبێت) فەرمووی: ﴿قالَ هِيَ راوَدَتْني عَنْ نَفْسي﴾ یوسف: ٢٦ واتە: نەخێر وا نییە! ئەو ویستی من لە خشتە بەرێت!..

مێردەکەی زولەیخا تووشی سەرسووڕمان بوو.. نەیدەزانی بڕوا بە کامیان بکات.. بە هاوسەر و هاودەمەکەی.. یان بە یوسف(سڵاوی خوای لێبێت)ی پاک و بێ گوناه!.. بۆیە ﴿وَ شَهِدَ شاهِدٌ مِنْ أَهْلِها إِنْ كانَ قَميصُهُ قُدَّ مِنْ قُبُلٍ فَصَدَقَتْ وَ هُوَ مِنَ الْكاذِبينَ * وَ إِنْ كانَ قَميصُهُ قُدَّ مِنْ دُبُرٍ فَكَذَبَتْ وَ هُوَ مِنَ الصّادِقينَ﴾ یوسف: ٢٦–٢٧ واتە: یەکێك لە خزمانی ژنەکە (کە گوێی لە بەسەرهاتەکە بوو) شایەتی دا و وتی: ئەگەر کراسەکەی یوسف(سڵاوی خوای لێبێت) لە پێشەوە دڕابێت ئەوە ژنەکە ڕاست دەکات و ئەو کاتە یوسف(سڵاوی خوای لێبێت) یەکێکە لە درۆزنان... خۆ ئەگەر کراسەکەی لە پشتەوە دڕابێت ژنەکە درۆ دەکات و یوسف(سڵاوی خوای لێبێت) یەکێکە لە ڕاستگۆیان.

عەزیزی میسر کە مێردی ژنەکە بوو، سەیرێکی کراسەکەی یوسف(سڵاوی خوای لێبێت)ی کرد.. ﴿فَلَمّا رَأی قَمیصَهُ قُدَّ مِنْ دُبُر قالَ إِنَّهُ مِنْ كَیْدِكُنَّ إِنَّ كَیْدَكُنَّ عَظیمٌ﴾ یوسف: ٢٨ واتە: کاتێك مێردەکەی بینی کراسەکەی یوسف لە پشتەوە دڕاوە، بە ژنەکەی وت: بەڕاستی ئەمە پیلان و نەخشەی خۆتانە، بێگومان فێڵ و تەڵەکە و نەخشە و پیلانی ئێوە زۆر گەورەیە (لەم جۆرە شتانەدا).

دوایی عەزیزی میسر وتی: ﴿یُوسُفُ أَعْرِضْ عَنْ هذا وَ اسْتَغْفِري لِذَنْبِكِ إِنَّكِ كُنْتِ مِنَ الْخاطِئینَ﴾ یوسف: ٢٩ واتە: ئەی یوسف، ئەم باسە فەرامۆش بکە و گوێی مەدەرێ (بە ژنەکەیشی وت) تۆش داوای لێخۆشبوون و لێبووردن لە هەڵە و تاوانەکەت بکە، چونکە بەڕاستی تۆ لە گوناهباران و بەهەڵەچووانی.

سەرەڕای ئەوەی تاوانباری زولەیخا و بێتاوانی حەزرەتی یوسف(سڵاوی خوای لێبێت) دەرکەوت، کەچی یوسف(سڵاوی خوای لێبێت)ی پاک و بێتاوان خرایە زیندانەوە..

## لە نێو زینداندا

ماوەی چەند ساڵێک یوسف(سڵاوی خوای لێبێت) لە زینداندا مایەوە.. ڕۆژێک دوو پیاویان هێنا و زیندانی کران.. ئەو دوو پیاوە کارگوزاری نێو کۆشک بوون.. یەکێکیان چێشتلێنەر و ئەوی تریان مەیگێڕی بەردەستی پادشای میسر بوون..

بەیانییەک زیندانییەکان لە خەو هەستان.. ئەو دوو کەسە کە خزمەتکار بوون خەویان دیبوو.. ﴿قالَ أَحَدُهُما إِنِّي أَراني أَعْصِرُ خَمْراً وَ قالَ الْآخَرُ إِنِّي أَراني أَحْمِلُ فَوْقَ رَأْسي خُبْزاً تَأْكُلُ الطَّیْرُ مِنْهُ نَبِّئْنا بِتَأْویلِهِ إِنّا نَراكَ مِنَ الْمُحْسِنینَ﴾ یوسف: ٣٦ واتە: یەکێکیان وتی: بێگومان من خۆمم دەبینی لە خەونمدا ترێم دەگوشی و شەرابم لێ دروست دەکرد، ئەوی تریشیان وتی: بەڕاستی من خۆمم دەبینی لە خەونمدا نانم بەسەر سەرمەوە هەڵدەگرت، باڵندە لێی دەخوارد، ئاگادارمان بکە بە لێکدانەوەی ئەم خەونە، چونکە بەڕاستی ئێمە دەبینین تۆ لە چاکە خوازانیت و (شارەزای لە لێکدانەوەی خەوندا).

یوسف(سڵاوی خوای لێبێت)ی ڕاستگۆ خەونەکانی بۆ لێکدانەوە و فەرمووی: ﴿یا صاحِبَيِ السِّجْنِ أَمّا أَحَدُكُما فَیَسْقي رَبَّهُ خَمْراً وَ أَمَّا الْآخَرُ فَیُصْلَبُ فَتَأْكُلُ الطَّیْرُ مِنْ رَأْسِهِ قُضِيَ الْأَمْرُ الَّذي فیهِ تَسْتَفْتِیانِ﴾ یوسف: ٤١ واتە: ئەی هاوەڵانی زیندانیم، ئەوەتان کە لە خەونیدا ترێی دەگوشی، دەبێتە ساقی پادشا و ڕزگاری دەبێت و شەرابی پێشکەش دەکات، ئەوی تریشتان لە خاچ دەدرێت و باڵندە لەسەر و ڕووخساری دەخوات، ئیتر ئەمەش وەڵامی لێکدانەوەی خەونەکانتانە و هەر ئەوەش بڕیار دراوە.



## خەونی پادشا

بۆ ڕۆژی دوایی ئەو دوو لاوە ئازاد کران.. مەیگێڕەکە ڕۆیشتەوە سەر کاری پێشووی خۆی.. بەڵام چێشتلێنەرەکە لە خاچ درا..

مەیگێڕەکە بەڵێنی بە حەزرەتی یوسف(سڵاوی خوای لێبێت) دابوو لای پادشا باسی ستەملێکراویی ئەو بکات.. بەڵام لە بیری چوویەوە.. بۆیە بۆ چەند ساڵێکی تر یوسف(سڵاوی خوای لێبێت) لە زینداندا مایەوە..

شەوێک پادشا خەونێکی زۆر سەیری بینی.. پادشا بە خەوپەرژینەکان و کاربەدەستانی خۆی وت: ﴿إِنِّي أَرى سَبْعَ بَقَراتٍ سِمانٍ يَأْكُلُهُنَّ سَبْعٌ عِجافٌ وَ سَبْعَ سُنْبُلاتٍ خُضْرٍ وَ أُخَرَ يابِساتٍ يا أَيُّهَا الْمَلَأُ أَفْتُوني في رُءْيايَ إِنْ كُنْتُمْ لِلرُّءْيا تَعْبُرُونَ﴾ یوسف: ٤٣ واتە: بەڕاستی من لە خەونمدا بینیم کە حەوت مانگای قەڵەو، لەلایەن حەوت مەنگای لەڕ و لاوازەوە خوران، حەوت گوڵەگەنمی سەوز و جوان و حەوتی وشکیشم بینی، ئەی زانا و شارەزایان ئەم خەونەم بۆ لێك بدەنەوە ئەگەر خەون لێك دەدەنەوە.

هیچیان نەیان توانی خەونەکەی پادشا لێک بدەنەوە، بۆیە وتیان: ﴿أَضْغاثُ أَحْلامٍ وَ ما نَحْنُ بِتَأْويلِ الْأَحْلامِ بِعالِمينَ﴾ یوسف: ٤٤ واتە: ئەم خەونە بێ سەروبنە و هیچ نییە، ئێمە لە لێکدانەوەی خەونی بێ سەروبن شارەزا نین.



ئا لەو کاتەدا مەیگێڕەکە یوسف(سڵاوی خوای لێبێت)ی بیر کەوتەوە و وتی: ﴿أَنَا أُنَبِّئُكُم بِتَأْوِيلِهِ فَأَرْسِلُونِ﴾ یوسف: ٤٥ واتە: داواکارم بمنێرن (بۆ لای یوسف) من هەواڵی (لێکدانەوەی ئەو خەونەتان) پێ ڕادەگەیەنم.

## داڕووخانی ئابووری

مەیگێڕەکە هاتەوە بۆ لای یوسف(سڵاوی خوای لێبێت).. خەونەکەی پاشای بۆ گێڕایەوە.. یوسف(سڵاوی خوای لێبێت) خەوپەرژینی کرد و فەرمووی: حەوت ساڵی پڕ لە خێر و خۆشیتان لەبەرن.. دوایی حەوت ساڵ قاتی و قڕی و بێ بارانی و وشکە ساڵی دێنە پێشەوە..

هەر بۆ ئەو مەبەستەش ڕێگا چارەی بۆ دیاری کردن و فەرمووی: ﴿تَزْرَعُونَ سَبْعَ سِنِينَ دَأَبًا فَمَا حَصَدتُّمْ فَذَرُوهُ فِي سُنبُلِهِ إِلَّا قَلِيلًا مِّمَّا تَأْكُلُونَ * ثُمَّ يَأْتِي مِن بَعْدِ ذَٰلِكَ سَبْعٌ شِدَادٌ يَأْكُلْنَ مَا قَدَّمْتُمْ لَهُنَّ إِلَّا قَلِيلًا مِّمَّا تُحْصِنُونَ * ثُمَّ يَأْتِي مِن بَعْدِ ذَٰلِكَ عَامٌ فِيهِ يُغَاثُ النَّاسُ وَفِيهِ يَعْصِرُونَ﴾ یوسف: ٤٧ـ٤٩ واتە: (یوسف) وتی: حەوت ساڵی بەردەوام کشتوکاڵ دەکەن و دانەوێڵە دەچێنن، ئەوەی کە دروێنەتان کرد و لێتان زیاد بوو بەگوڵەکەیەوە بیهێڵنەوە، مەگەر ئەو کەمەی کە دەیخۆن (دانەوێڵە بە گوڵەکەیەوە هەڵبگیرێت لە کرم و ئەسپێ و زایە بوون بەدوور دەبێت)... پاشان لە دوای ئەوە حەوت ساڵ گرانیی و سەختی پێش دێت، ئەوەی کە زەخیرەتان کردووە بۆ ئەو ساڵانە هەمووی دەخۆن، مەگەر کەمێکی نەبێت کە هەڵی دەگرن (بۆ تۆو)... لەوەودوا ساڵێکی باراناوی و پڕ بەرەکەت دێت کە خەڵکی بەروبوومی زۆریان پێ دەبەخشرێت، میوە دەگوشن و شەربەتی لێ دروست دەکەن.

کابرای مەیگێڕ ڕۆیشتەوە بۆ لای پادشا و لێکدانەوە و چارەسەریشی بۆ پادشا گێڕایەوە.. پادشا هەستی کرد یوسف(سڵاوی خوای لێبێت) تاکە کەسە بتوانێ ڕووبەڕووی کێشەی ئابووری ببێتەوە.. بۆیە فەرمانی دەرکرد بۆ ئەوەی یوسف(سڵاوی خوای لێبێت) لە زیندان ئازاد بکرێ.. بەڵام حەزرەتی یوسف(سڵاوی خوای لێبێت) بە مەرجێ ڕازی بوو لە زیندان بێتە دەرەوە، پاکێتی ئەو بسەلمێ و زولەیخا و ژنەکانی تریش دان بە تاوانی خۆیاندا بنێن!.. بۆیە بە مەیگێڕی فەرموو: ﴿ارْجِعْ إِلَىٰ رَبِّكَ فَاسْأَلْهُ مَا بَالُ النِّسْوَةِ اللَّاتِي قَطَّعْنَ أَيْدِيَهُنَّ إِنَّ رَبِّي بِكَيْدِهِنَّ عَلِيمٌ﴾ یوسف: ٥٠ واتە: بگەڕێرەوە بۆ لای پاشا و جا پێی بڵێ: هۆی چی بوو ئەو ئافرەتانە کاتی خۆی دەستی خۆیان بری و برینداریان کرد (ئایا من هیچ تاوانێکم لەوەدا هەیە؟!) بەڕاستی هەر پەروەردگارم بە ئاگایە لە فێڵ و تەڵەکە و پیلانیان.



پادشا لە وەڵامدا وتی: ﴿وَقَالَ الْمَلِكُ ائْتُونِي بِهِ أَسْتَخْلِصْهُ لِنَفْسِي فَلَمَّا كَلَّمَهُ قَالَ إِنَّكَ الْيَوْمَ لَدَيْنَا مَكِينٌ أَمِينٌ﴾ یوسف: ٥٤ واتە: ئادەی بچن بۆم بهێنن، ئەو (لاوە پاکە ژیرە زانایە) تایبەتی دەکەم بۆ خۆم و لە نزیکانی من بێت، جا کاتێك (هێنایان) و پادشا قسەی لەگەڵ کرد، وتی: ئەمڕۆ ئیتر بەڕاستی تۆ لای ئێمە خاوەنی پلە و جێگەی متمانە و باوەڕی.

بەوجۆرە یوسف(سڵاوی خوای لێبێت) بوو بە عەزیزی میسر.. بوو بە کەسی دووەمی وڵاتی میسر..

## وشکەساڵی

لە ماوەی حەوت ساڵدا حەزرەتی یوسف(سڵاوی خوای لێبێت) هەموو کاروبارەکانی کشتوکاڵ و ئاو و ئاودێری وڵاتی میسری ڕێکخست.. جگە لەوەش چەند کۆگایەکی زۆر گەورەی بۆ هەڵگرتنی دانەوێڵە دروست کرد..

تا ئەو حەوت ساڵە تەواو بوو، هەموو ساڵێک بەرهەمی کشتوکاڵ و جوتیاری زۆر لەبار و پڕ پیت و فەڕ و بەرکەت بوو.. حەزرەتی یوسف(سڵاوی خوای لێبێت)یش هەموو گوڵەگەنمەکانی بە ساغی لە نێو کۆگاکاندا هەڵدەگرت و ئەوەندەی کە پێویستی خواردن بووایە بە سەر خەڵکدا دابەشی دەکرد..

بەو جۆرە حەوت ساڵی پڕ لە خێر و خۆشی تێپەڕی.. ساڵانی وشکەساڵی و قاتوقڕی دەستی پێکرد.. باران نەما.. جۆگە ئاوەکان وشک بوون و ئاوی پێویست نەما.. ساڵ لە دوای ساڵ وشکەساڵی زیاتر دەبوو.. کانی و چاوگەکان زیاتر کەم ئاو و دوایی وشک دەبوون.. لەو ماوەدا حەزرەتی یوسف(سڵاوی خوای لێبێت) دەرگای کۆگاکانی بەڕووی خەڵکدا کردەوە و خەڵک دەهاتن بۆ وەرگرتنی دانەوێڵە..

وشکە ساڵی تەنیا لە وڵاتی میسر نەبوو.. بەڵکو زۆربەی وڵاتانی ئەو ناوچەیەی گرتبوویەوە.. حەزرەتی یوسف(سڵاوی خوای لێبێت)یش کەسێکی مرۆڤ دۆست بوو.. دەرگای خێر و چاکەی بە ڕووی هیچ کەسێکدا دانەدەخست.. هەرکەسێک بهاتایە و داوای یارمەتی بکردایە، ئەو یارمەتی دەدا و دانەویڵەی بۆ دابین دەکرد..

## کاروانی فەلەستینییەکان

ڕۆژێک کاروانێک لە وڵاتی فەلەستینەوە ڕوی لە میسر کرد.. لە نێو ئەو کاروانەدا دە پیاو هەبوون.. ئەو دە پیاوە هاتنە لای یوسف(سڵاوی خوای لێبێت)ی راستگۆ و سەری ڕێزیان بۆ دانەواند..

یوسف(سڵاوی خوای لێبێت) یەکسەر ئەو دە پیاوەی ناسییەوە.. ئەوانە براکانی بوون.. ئەو برایانەی کە ئەویان کرد بە گورگ خواردوو و فڕێیان دابوویە نێو بیرەوە.. ئەوانە کوڕەکانی حەزرەتی یەعقوب(سڵاوی خوای لێبێت) بوون.. بەڵام ئەوان یوسف(سڵاوی خوای لێبێت)یان نەناسییەوە..

یوسف(سڵاوی خوای لێبێت) زۆر بە گەرمی بەخێرهاتنی کردن و کۆڵ و بارەکانی پڕ کردن لە دانەوێڵە و پرسیاری وڵات و شار و گوندی لێ کردن.. ئەوانیش وەڵامیان دایەوە و وتیان: ئێمە نەوەی حەزرەتی ئیبراهیم(سڵاوی خوای لێبێت)ی خۆشەویستی خوای گەورەین!.. ئێمە دوانزە برا بووین، یەکێکمان ناوی یوسف(سڵاوی خوای لێبێت) بوو مردووە، کاتی خۆی گورگ خواردی!..

حەزرەتی یوسف(سڵاوی خوای لێبێت) لێی پرسین: ئەگەر ئێوە دوانزە برابوون و یەکێکتان مردووە، کوا ئەو براکەتان لە کوێیە؟!..

براکان وتیان: باوکمان ئەوی لە گەڵ ئێمەدا نەناردووە!..

فەرمووی: بۆچی؟..

وتیان: چونکە دەترسا گورگ بیخوات!..



دواتر براکان بە یوسف(سڵاوی خوای لێبێت)یان وت کە باوکمان تا ئێستاش بۆ یوسف(سڵاوی خوای لێبێت) دەگری.. ئەوەندە گریاوە چاوەکانی کوێر بوون..
دوای ئەوەی براکان ڕۆیشتنەوە یوسف(سڵاوی خوای لێبێت) بە بێدەنگی و بە پەنامەکی دەستی کرد بە گریان..

## من یوسفم!

حەزرەتی یوسف(سڵاوی خوای لێبێت) بە براکانی فەرموو: ﴿ائْتُونِي بِأَخٍ لَكُمْ مِنْ أَبِيكُمْ أَلاَ تَرَوْنَ أَنِّي أُوفِي الْكَيْلَ وَأَنَا خَيْرُ الْمُنزِلِينَ * فَإِنْ لَمْ تَأْتُونِي بِهِ فَلاَ كَيْلَ لَكُمْ عِنْدِي وَ لاَ تَقْرَبُونِ﴾ یوسف: ٥٩ ـ ٦٠ واتە: (من حەز دەکەم) برایەکی باوکیتان هەیە بۆم بهێنن، ئایا نابینن بەڕاستی من چۆن کێشانە و پێوانەم تێر و تەواوە و چۆن ڕێز لە میوان دەگرم (یارمەتی هەژاران دەدەم)... خۆ ئەگەر ئەو برایەتانم بۆ نەهێنن، ئەوە ئیتر هیچ موعامەلە و کێشانە و پێوانەی ئێوە لای من نییە و نزیکم مەکەونەوە.
براکان لە وەڵامدا وتیان: ﴿سَنُرَاوِدُ عَنْهُ أَبَاهُ وَ إِنَّا لَفَاعِلُونَ﴾ یوسف: ٦١ واتە: ئێمە بە هەموو شێوەیەك هەوڵ دەدەین و نەخشە دەکێشین بۆ ئەو مەبەستە (هەتا) باوکی ڕازی بکەین (ئەم جارە بیهێنین)، بێگومان ئێمە ئەو کارە دەکەین.
کاتێ براکان گەڕانەوە بۆ فەلەستین و بۆ شوێنی خۆیان، داوایان لە حەزرەتی یەعقوب(سڵاوی خوای لێبێت) کرد بۆ جاری داهاتوو بنیامینیشیان لەگەڵدا بنێرێت...
حەزرەتی یەعقوب(سڵاوی خوای لێبێت) بە دڵێکی پڕ لە خەمەوە فەرمووی: ﴿هَلْ آمَنُكُمْ عَلَيْهِ إِلاَّ كَمَا أَمِنتُكُمْ عَلَى أَخِيهِ مِنْ قَبْلُ﴾ یوسف: ٦٤ واتە: (ئەمە داخوازییەکی سەیرە) ئایا هەروا متمانەتان پێ بکەم لەسەری، مەگەر هەروەك پێشتر متمانەم پێکردن لەسەر یوسفی برای؟!. ئیتر حەزرەتی یەعقوب(سڵاوی خوای لێبێت) دەستی کرد بە گریان بۆ یوسف(سڵاوی خوای لێبێت)ی کوڕی..
دوایی براکان دەمی تورەکە و کۆڵ و بارەکانیان کردەوە، دەبینن پارەی گەنم کڕینەکەیان خراوەتەوە نێو کۆڵ و بارەکان و هیچیان لێ وەرنەگرتوون و بە خۆڕایی گەنمیان پێ بەخشیوون.. بۆیە هەمووان توشی شاگەشکە بوون و بە حەزرەتی یەعقوب(سڵاوی خوای لێبێت)یان وت: ﴿يَا أَبَانَا مَا نَبْغِي هَذِهِ بِضَاعَتُنَا رُدَّتْ إِلَيْنَا وَ نَمِيرُ أَهْلَنَا وَنَحْفَظُ أَخَانَا وَ نَزْدَادُ كَيْلَ بَعِيرٍ ذَالِكَ كَيْلٌ يَسِيرٌ﴾ یوسف: ٦٥ واتە: باوکی بەڕێزمان ئێمە چیمان دەوێ، چی بڵێین (لە بەرامبەر ئەو پادشا بەڕێزەوە) ئەوەتە هەرچی کەلوپەلمان هەیە گەڕێنراوەتەوە بۆمان و (تۆ ئەگەر مۆڵەتی بنیامین بدەی) ڕزق و ڕۆزیی زۆر دەهێنین بۆ کەس و کارمان، براکەشمان دەپارێزین و باری وشترێکیش زیاتر دەهێنین، ئەو بارەش شتێکی ئاسانە.



حەزرەتی یەعقوب(سڵاوی خوای لێبێت) فەرمووی: ﴿لَنْ أُرْسِلَهُ مَعَكُمْ حَتَّى تُؤْتُونِ مَوْثِقاً مِنَ اللهِ لَتَأْتُنَّنِي بِهِ إِلاَّ أَنْ يُحَاطَ بِكُمْ﴾ یوسف: ٦٦ واتە: هەرگیز لەگەڵتاندا ناینێرم هەتا پەیمانێکی خواییم پێ نەدەن (سوێند نەخۆن) کە بێگومان بیهێننەوە بۆ لام، مەگەر دەورە بدرێن و هیچ دەسەڵاتتان نەمێنێت.

جا کاتێك براکان پەیمانەکەیان دایە و سوێندیان بۆ خوارد، یەعقوب(سڵاوی خوای لێبێت) وتی: خوا خۆی ئاگادار و چاودێرە بەو پەیمانەی کە بڕیارمان لەسەر داوە.

بۆ جاری دووەم کاروان بەرەو میسر وەڕێکەوتەوە.. عەزیزی میسر پێشوازییەکی گەرمی لە یانزە براکە کرد.. خواردنێکی باشی پێدان.. دوو دوو لە سەر سینی و خوانێک دانیشتن.. بونیامین بە تەنیا مایەوە.. بونیامین زۆر خەمبار بوو.. عەزیزی میسر لێی پرسی: بۆچی وا دۆش داماوی؟..

بونیامین وتی: ئاخر من برایەکی دایک و باوکیم هەبوو ناوی یوسف(سڵاوی خوای لێبێت) بوو، گورگ خواردی!..

عەزیزی میسر وتی: هەر بە ڕاستی گورگ خواردی؟..

بونیامین وتی: ئەوانە وا دەڵێن!.. بەڵام باوکم هەرگیز بڕوای پێ نەکردن و تا ئێستاش بۆ یوسف(سڵاوی خوای لێبێت) دەگری.. ئەوەندە گریاوە کوێرایی داهاتووە و چاوەکانی نابینن!..

عەزیزی میسر بە بونیامینی وت: ئەگەر یوسف(سڵاوی خوای لێبێت)ی برات ببینی دەیناسیتەوە؟

بونیامین وتی: نازانم!.. لەوانەیە بیناسمەوە!..

عەزیز وتی: گوێ بگرە بونیامین! ئەو برایانەی تۆ ئێرەییان بە یوسف(سڵاوی خوای لێبێت) برد، بردیان بۆ دەشت و سارایەکی دوور و چۆڵ.. لەوێ فڕێیان دایە نێو بیرێکەوە.. یوسف(سڵاوی خوای لێبێت) هێشتا زیندووە.. دوایی عەزیزی میسر بە ئەسپایی بە گوێی بونیامینی چپاند و فەرمووی: ﴿إِنِّي أَنَا أَخُوكَ فَلاَ تَبْتَئِسْ بِمَا كَانُوا يَعْمَلُونَ﴾ یوسف: ٦٩ واتە: بەڕاستی من یوسفی براتم، جا خەفەت مەخۆ و خەمت نەبێت بەو هەڵسوکەوتەی ئەوان دەیانکرد.

دوایی یوسف(سڵاوی خوای لێبێت) فەرمووی: بەڕاستی خوای گەورە چاکەی زۆری لە گەڵ من کردووە و کردوومی بە عەزیزی میسر.. هیچ بە براکانمان مەڵێ.. من خۆم بە فێڵێک تۆ لێرە لای خۆم دەهێڵمەوە.. خەمی هیچت نەبێ!..



## پلان دانان

کاروانەکە خۆیان بۆ گەڕانەوە ئامادە کرد.. براکان هاتن بۆ ئەوەی بونیامینیش لەگەڵ خۆیان ببەنەوە.. وتیان: جەنابی عەزیزی میسر! باوکمان ئامۆژگاری ئێمەی کردووە کە بە هەموو جۆرێ ئاگامان لە بونیامینی برامان بێت..

حەزرەتی یوسف(سڵاوی خوای لێبێت) فەرمانی بەسەر فەرمانبەرەکانی بەردەستیدا کردبوو جامی گەنم پیوانەکردنەکە بخەنە نێو کۆڵ و بارەکەی بونیامینەوە.. ئەو جامە لە زیوێکی گرانبەها دروست کرابوو..

کاروان کەوتە رێ و ویستی میسر بەجێبهێڵێت.. لە ناکاو سەربازەکان ئابلۆقەی کاروانیان دا و جارچییەک وتی: ﴿أَيَّتُهَا الْعِيرُ إِنَّكُمْ لَسَارِقُونَ﴾ یوسف: ٧٠ واتە: ئەی کاروانچییان! بەڕاستی ئێوە دزن!..

جگە لە بونیامین هەمووان توشی شۆک بوون.. وتیان: بە دوای چیدا دەگەڕێن؟..

سەربازەکان وتیان: ﴿نَفْقِدُ صُوَاعَ الْمَلِكِ وَ لِمَنْ جَاءَ بِهِ حِمْلُ بَعِيرٍ وَ أَنَا بِهِ زَعِيمٌ﴾ یوسف: ٧٢ واتە: جامولکە و دەفری پادشامان لێ ون بووە و بۆی دەگەڕێن، هەر کەسێك هێنای باری وشترێکی بۆ هەیە (لێپرسراوەکەیان وتی): من دەبمە زامنی ئەو بەڵێنە.

کاروانچییەکان وتیان: ﴿تَاللهِ لَقَدْ عَلِمْتُمْ مَا جِئْنَا لِنُفْسِدَ فِي الْأَرْضِ وَ مَا كُنَّا سَارِقِينَ﴾ یوسف: ٧٣ واتە: سوێند بە خوا، بەڕاستی ئێوە چاك دەزانن کە ئێمە بۆ ئەوە نەهاتووین فەساد و خراپە لە زەویدا بکەین و ئێمە دزنین.

عەزیزی میسر خۆی تەشریفی هێنا و کۆڵ و باری هەمووانی پشکنی.. کاتێ سەرە هاتە سەر کۆڵ و باری بونیامینی برای، دەستی کرد بە ناو گەنمەکەدا و جامولکەکەی دەرهێنا..

براکان هەموویان پەشۆکان.. کەچی بونیامین هیچ تێکنەچوو.. لەولاوە بە بێ دەنگی بۆ خۆی وەستابوو..

یوسف(سڵاوی خوای لێبێت) فەرمووی: ئێستا چی دەڵێن؟!..

وتیان: ﴿إِنْ يَسْرِقْ فَقَدْ سَرَقَ أَخٌ لَهُ مِنْ قَبْلُ﴾ یوسف: ٧٧ واتە: ئەگەر ئەو دزی کردبێ، ئەوا براکەیشی لە پێشودا دزی کردووە!!..

حەزرەتی یوسف(سڵاوی خوای لێبێت) زۆر خەمبار بوو.. چونکە براکانی هێشتا ئێرەییان بەو دەبرد.. هێشتا لە تاوان و گوناهی خۆیان پەشیمان نەبوونەوە.. بۆیە فەرمووی: ﴿أَنْتُمْ شَرٌّ مَكَاناً وَاللهُ أَعْلَمُ بِمَا تَصِفُونَ﴾ یوسف: ٧٧ واتە: ئێوە لە کەسانێکی باش ناچن، جا خوا خۆی لە هەموو کەس زاناترە بەو شتەی ئێوە باسی دەکەن.

براگەورەکەیان بە حەزرەتی یوسف(سڵاوی خوای لێبێت)ی وت: جەنابی عەزیز! ئەمە پیرە باوکێکی هەیە بەڵێنێکی قورسی لە ئێمە سەندووە بۆ ئەوەی بونیامینی بۆ بگەڕێنینەوە، لەجیاتی ئەو یەکێک لە ئێمە گل بدەرەوە با بونیامین بڕواتەوە بۆ لای باوکمان!..

عەزیزی میسر فەرمووی: ﴿مَعَاذَ اللهِ أَنْ نَأْخُذَ إِلاَّ مَنْ وَجَدْنَا مَتَاعَنَا عِنْدَهُ إِنَّا إِذاً لَظَالِمُونَ﴾ یوسف: ٧٩ واتە: پەنا بەخوا، ئەگەر هەڵەی وا بکەین تەنها ئەو کەسە گل دەدەینەوە کە شتومەکەکانمان لەلای دۆزیوەتەوە، خۆ ئەگەر وا نەکەین، ئەوە ئیتر ئێمە بەڕاستی ستەمکارین.

براکان گەڕانەوە بۆ وڵاتی خۆیان.. چیرۆکەکەیان بۆ باوکیان گێڕایەوە.. بەڵام براگەورەکەیان شەرمی لە باوکی دەکرد و ڕووی نەبوو بگەڕێتەوە بۆ وڵاتی خۆیان و هەر لە میسر مایەوە..

حەزرەتی یەعقوب(سڵاوی خوای لێبێت) گۆچانەکەی گرت بە دەستەوە و هەستایە سەرپێ و فەرمووی: ﴿بَلْ سَوَّلَتْ لَكُمْ أَنفُسُكُمْ أَمْراً فَصَبْرٌ جَمِيلٌ عَسَى اللهُ أَنْ يَأْتِيَنِي بِهِمْ جَمِيعاً إِنَّهُ هُوَ الْعَلِيمُ الْحَكِيمُ﴾ یوسف: ٨٣ واتە: (وانییە) بەڵکو دیسانەوە خۆتان پیلانێکی ترتان ڕێك خستووە، جا چارم نییە خۆگریەکی جوان نەبێت، ئومێدە پەروەردگار هەموویانم بۆ بهێنێتەوە و بە هەموویان شاد ببم، بەڕاستی ئەو زاتە زانا و دانایە.

دواتر بیری یوسف(سڵاوی خوای لێبێت)ی کردەوە و بە دەم گریانەوە فەرمووی: ئەی داخی گرانم بۆ یوسف(سڵاوی خوای لێبێت)ی نازدار..

چەند ڕۆژێک حەزرەتی یەعقوب(سڵاوی خوای لێبێت) بێدەنگ بوو.. دوایی بە کوڕەکانی فەرموو: ﴿يَا بَنِيَّ اذْهَبُوا فَتَحَسَّسُوا مِنْ يُوسُفَ وَ أَخِيهِ وَ لاَ تَيْئَسُوا مِنْ رَوْحِ اللهِ إِنَّهُ لاَ يَيْئَسُ مِنْ رَوْحِ اللهِ إِلاَّ الْقَوْمُ الْكَافِرُونَ﴾ یوسف: ٨٧ واتە: کوڕەکانم بچنەوە و گوێ هەڵخەن بۆ یوسف و براکەی، لە سۆز و میهرەبانی خوایش نائومێد مەبن، چونکە بەڕاستی جگە لە کەسانی خوانەناس و بێ باوەڕ نەبێ، کەس نائومێد نابێت لە سۆز و میهرەبانی خوا.

## پێکشادبوونەوە

گەنم نەما.. خەم و خەفەت دیسان لە ماڵی حەزرەتی یەعقوب(سڵاوی خوای لێبێت) هەر ڕووی لە زیاد بوون بوو.. حەزرەتی یەعقوب(سڵاوی خوای لێبێت) سێ کوڕی لە دەست دابوو.. یوسف(سڵاوی خوای لێبێت)، بونیامین و کوڕە گەورەکەیشی!..

حەزرەتی یەعقوب(سڵاوی خوای لێبێت) بە کوڕەکانی فەرموو: جارێکیتر بچنەوە بۆ میسر..

کوڕەکان ڕۆیشتنەوە بۆ میسر و بە لاڵانەوە و کڕوزانەوە بە عەزیزی میسریان وت: ﴿يَا أَيُّهَا الْعَزِيزُ مَسَّنَا وَ أَهْلَنَا الضُّرُّ وَ جِئْنَا بِبِضَاعَةٍ مُزْجَاةٍ فَأَوْفِ لَنَا الْكَيْلَ وَ تَصَدَّقْ عَلَيْنَا إِنَّ اللهَ يَجْزِي الْمُتَصَدِّقِينَ﴾ یوسف: ٨٨ واتە: جەنابی عەزیز! ئێمە و کەس و کارمان نەهاتی و گرانی و کوێرەوەریی زۆرمان تووش هاتووە و کەلوپەلێکی تێکەڵ و پێکەڵ و بێ نرخیشمان هێناوە، کەواتە چیمان پێویستە بۆمان بپێوە و خێریشمان پێ بکە، بێگومان خوا پاداشتی خێر خوازان دەداتەوە.

براکان بونیامینیان لای عەزیزی میسر بینی.. بونیامین زۆر ڕێزی لێ دەگیرا و وەکو پیاوێکی خاوەن شکۆ مامەڵەی لەگەڵدا دەکرا.. بۆیە هەموان سەریان سوڕما..

عەزیزی میسر زانی کاتی ئەوە هاتووە کە ئیتر خۆی بناسێنێ، بۆیە فەرمووی: ﴿هَلْ عَلِمْتُمْ مَا فَعَلْتُمْ بِيُوسُفَ وَ أَخِيهِ إِذْ أَنْتُمْ جَاهِلُونَ﴾ یوسف: ٨٩ واتە: ئایا زانیتان و لە بیرتانە چیتان کرد بە یوسف و بە براکەی کاتێك ئێوە نەفام بوون و ترسی خواتان لە دڵدا نەبوو؟.

دوای ئەوەی کوڕەکان هەموویان گەڕانەوە، چوونە خزمەت باوکیان و وتیان: ﴿يَا أَبَانَا اسْتَغْفِرْ لَنَا ذُنُوبَنَا إِنَّا كُنَّا خَاطِئِينَ﴾ یوسف: ٩٧ واتە: ئەی باوکی بەڕێزمان داوای لێخۆشبوونی گوناهەکانمان بۆ بکە (لە خوای میهرەبان) بەڕاستی ئێمە گوناهکار بووین و بەهەڵەدا چوو بووین.

براكان بە ئاگا هاتنەوە.. هەموو شتێکیان بۆ دەرکەوت.. عەزیزی میسر.. فەرمانڕەوای گەورە.. خاوەن شکۆ.. یوسف(سڵاوی خوای لێبێت)ی برای ئەوانە!.. بۆیە هەمووان حەپەسان و بە یەکەوە وتیان: ﴿أَئِنَّكَ لَأَنْتَ يُوسُفُ﴾ یوسف: ٩٠ واتە: ئایا بەڕاست تۆ خۆت یوسفیت؟..

حەزرەتی یوسف(سڵاوی خوای لێبێت) فەرمووی: ﴿أَنَا يُوسُفُ وَ هٰذَا أَخِي قَدْ مَنَّ اللهُ عَلَيْنَا إِنَّهُ مَنْ يَتَّقِ وَ يَصْبِرْ فَإِنَّ اللهَ لاَ يُضِيعُ أَجْرَ الْمُحْسِنِينَ﴾ یوسف: ٩٠ واتە: بەڵێ، من یوسفم و ئەمەش (بونیامین)ـی برامە، بەڕاستی خوای میهرەبان ڕێزی لێناوین و بەهرەمەندی کردووین، بێگومان ئەوەی خۆپارێز بێت لە گوناه و خۆگر بێت (لە بەرامبەر پێشهاتەکانەوە، خوای گەورە دەرووی لێ دەکاتەوە) ئەوە بەڕاستی خوا پاداشتی چاکەکاران و چاکەخوازان بەزایە نادات.

براکان وتیان: ﴿تَاللهِ لَقَدْ آثَرَكَ اللهُ عَلَيْنَا وَ إِنْ كُنَّا لَخَاطِئِينَ﴾ یوسف: ٩١ واتە: سوێندمان بەخوا بەڕاستی خوای گەورە ڕێزی تۆی داوە بەسەر ئێمەدا، ئێمە بەڕاستی کاتی خۆی بەهەڵەدا چووین و گوناهبارین.

حەزرەتی یوسف(سڵاوی خوای لێبێت) زەردەخەنەیەکی کرد و فەرمووی: ﴿لاَ تَثْرِيبَ عَلَيْكُمُ الْيَوْمَ يَغْفِرُ اللهُ لَكُمْ وَ هُوَ أَرْحَمُ الرَّاحِمِينَ﴾ یوسف: ٩٢ واتە: خەمتان نەبێت ئەمڕۆ ئیتر هیچ سەر زەنشتێکتان لەسەر نییە، خوا لێتان خۆش بێت، بێگومان ئەو زاتە لە هەموو میهرەبانان میهرەبانترە.

حەزرەتی یوسف(سڵاوی خوای لێبێت) کراسەکەی لە بەری خۆی داکەند و فەرمووی: ﴿اذْهَبُوا بِقَمِيصِي هَٰذَا فَأَلْقُوهُ عَلَى وَجْهِ أَبِي يَأْتِ بَصِيراً وَ أْتُونِي بِأَهْلِكُمْ أَجْمَعِينَ﴾ یوسف: ٩٣ واتە: بڕۆن ئەم کراسەم بەرن و بیدەن بە سەر و ڕووی باوکمدا، بینایی بۆ دەگەڕێتەوە و چاوی چاك دەبێتەوە، پاشان هەموو کەس و کارتانم بۆ بهێنن بەگشتی.

براگەورەکەیان کراسەکەی حەزرەتی یوسف(سڵاوی خوای لێبێت)ی وەرگرت و بەپەلە بەرەو فەلەستین گەڕایەوە بۆ ئەوەی مزگێنی بدات بە باوکی.. شنەبا بۆنی کراسەکەی حەزرەتی یوسف(سڵاوی خوای لێبێت)ی پێش گەیشتنی براگەورەکە هەڵگرت و دای بە لوتی حەزرەتی یەعقوب(سڵاوی خوای لێبێت)دا..

حەزرەتی یەعقوب(سڵاوی خوای لێبێت) فەرمووی: ﴿إِنِّي لَأَجِدُ رِيحَ يُوسُفَ لَوْلاَ أَنْ تُفَنِّدُونِ﴾ یوسف: ٩٤ واتە: بەڕاستی من هەست بە بۆنی یوسف(سڵاوی خوای لێبێت) دەکەم، ئەگەر بەبێ هۆش و خەڵەفاوم نەزانن و (بڕوام پێبکەن).

هەندێ لە ماڵ و منداڵەکانی وتیان: ﴿تَاللهِ إِنَّكَ لَفِي ضَلاَلِكَ الْقَدِيمِ﴾ یوسف: ٩٥ واتە: سوێند بەخوا بێگومان تۆ هەر لە ناو سەرگەردانی و خەیاڵە کۆنەکەی خۆت دایت!!.

دوای ماوەیەک براکە گەیشتەوە ماڵ و کراسەکەی بردەوە بۆ باوکی.. حەزرەتی یەعقوب(سڵاوی خوای لێبێت) کراسەکەی دا بە سەر سەر و چاویدا.. کتوپڕ چاوەکانی چاک بوونەوە..

براکە وتی: باوکە گیان! یوسف(سڵاوی خوای لێبێت) ماوە و ئەو عەزیزی میسرە!..

حەزرەتی یەعقوب(سڵاوی خوای لێبێت) فەرمووی: ﴿أَلَمْ أَقُلْ لَكُمْ إِنِّي أَعْلَمُ مِنَ اللهِ مَا لاَ تَعْلَمُونَ﴾ یوسف: ٩٦ واتە: ئەی من پێم نەوتن: ئەوەی من لە لایەن خواوە دەیزانم ئێوە نایزانن؟!..

دوای ئەوەی کوڕەکان هەموویان گەڕانەوە، چوونە خزمەت باوکیان و وتیان: ﴿يَا أَبَانَا اسْتَغْفِرْ لَنَا ذُنُوبَنَا إِنَّا كُنَّا خَاطِئِينَ﴾ یوسف: ٩٧ واتە: ئەی باوکی بەڕێزمان داوای لێخۆشبوونی گوناهەکانمان بۆ بکە (لە خوای میهرەبان) بەڕاستی ئێمە گوناهکار بووین و بەهەڵەدا چوو بووین.

حەزرەتی یەعقوب(سڵاوی خوای لێبێت) فەرمووی: ﴿سَوْفَ أَسْتَغْفِرُ لَكُمْ رَبِّي إِنَّهُ هُوَ الْغَفُورُ الرَّحِيمُ﴾ یوسف: ٩٨ واتە: لە ئایندەدا داوای لێ خۆشبوونتان لە پەروەردگارم بۆ دەکەم، بەڕاستی ئەو زاتە لێخۆشبوو و میهرەبانە.

## بەدیهاتنی خەونەکەی حەزرەتی یوسف(سڵاوی خوای لێبێت)

حەزرەتی یەعقوب(سڵاوی خوای لێبێت) و ماڵ و منداڵی هەمووان بەرەو وڵاتی میسر وەڕێ کەوتن..

حەزرەتی یوسف(سڵاوی خوای لێبێت) هەر لە چاوەڕوانیدا بوو باوکی و خزم و کەسوکاری بگەنە میسر.. لەوێ کۆشکێکی بۆ ئەوان ئامادە کردبوو بۆ ئەوەی پێشوازییەکی گەرمیان لێ بکات..

هەمووان گەیشتنە کۆشک.. حەزرەتی یوسف(سڵاوی خوای لێبێت) ڕۆیشت بۆ لایان.. هەموویان لەبەر عەزیزی میسر هەستانەوە.. تەنانەت حەزرەتی یەعقوب(سڵاوی خوای لێبێت) و خێزانەکانیشی هەستانە سەرپێ..

حەزرەتی یوسف(سڵاوی خوای لێبێت) باوەشی بە حەزرەتی یەعقوب(سڵاوی خوای لێبێت)دا کرد.. هەمووان پێک شاد و شوکور بوونەوە.. دواتر هەموویان کڕنووشی ڕێزیان بۆ حەزرەتی یوسف(سڵاوی خوای لێبێت) برد.. حەزرەتی یوسف(سڵاوی خوای لێبێت) فەرمووی: ﴿يَا أَبَتِ هَذَا تَأْوِيلُ رُؤْيَايَ مِنْ قَبْلُ قَدْ جَعَلَهَا رَبِّي حَقّاً وَ قَدْ أَحْسَنَ بِي إِذْ أَخْرَجَنِي مِنَ السِّجْنِ وَ جَاءَ بِكُمْ مِنَ الْبَدْوِ مِنْ بَعْدِ أَنْ نَزَغَ الشَّيْطَانُ بَيْنِي وَ بَيْنَ إِخْوَتِي إِنَّ رَبِّي لَطِيفٌ لِمَا يَشَاءُ إِنَّهُ هُوَ الْعَلِيمُ الْحَكِيمُ﴾ یوسف: ١٠٠ واتە: باوکی بەڕێزم ئەمە لێکدانەوەی خەونەکەی ئەوسامە، کە بە منداڵی بینیم، ئەوەتە بێگومان پەروەردگارم هێنایەدی و بەڕاست دەرچوو، بەڕاستی ئەو زاتە چاکەی لەگەڵدا کردم و بەسۆز بوو بۆم، کاتێك لە زیندان ڕزگاری کردم، ئەوەتە ئێوەی لە بیابانەوە هێنایەوە و (بەیەك شادی کردینەوە) دوای ئەوەی شەیتان نێوانی من و براکانمی تێکدابوو، بەڕاستی پەروەردگارم بەسۆز و بەلوتفە بۆ هەرشتێك کە دەیەوێت (پەلەی نییە و ڕێگەی بەشێنەیی بۆ خۆش دەکات)، بێگومان ئەو زاتە زانایە (بەنهێنی و ئاشکرایی دروستکراوانی) و دانایە (بە نەخشەی ورد، هەرچی بیەوێت ئەنجامی دەدات).

دوایی حەزرەتی یوسف(سڵاوی خوای لێبێت) دەستەکانی بەرەو ئاسمان بەرز کردەوە و فەرمووی: ﴿رَبِّ قَدْ آتَيْتَنِي مِنَ الْمُلْكِ وَ عَلَّمْتَنِي مِنْ تَأْوِيلِ الأَحَادِيثِ فَاطِرَ السَّمَوَاتِ وَ الأَرْضِ أَنْتَ وَلِيِّ فِي الدُّنْيَا وَالآخِرَةِ تَوَفَّنِي مُسْلِماً وَ أَلْحِقْنِي بِالصَّالِحِينَ﴾ یوسف: ١٠١ واتە: پەروەردگارا بەڕاستی تۆ پاشایەتیت پێ بەخشیم و لە لێکدانەوەی خەون شارەزات کردم، ئەی بەدیهێنەری ئاسمانەکان و زەوی، تۆ پشت و پەنا و یار و یاوەری منیت لە دنیا و قیامەتدا، داواکارم کە بە موسڵمانی بم مرێنیت و بمخەیتە ڕیزی پاکانەوە و بمگەیەنیت بە کاروانی چاکان.

# چیرۆکی پێغەمبەران

5

قورئانی پیرۆز، ئەو کتێبەی کە خوای گەورە ناردوویەتی بۆ پێغەمبەری ئیسلام(صلی الله علیه وسلم)، گرنگترین و ڕاستترین سەرچاوەی ژیان و بەسەرهاتی پێغەمبەرانە.. چونکە قورئان لە لایەن خوای گەورە و میهرەبانەوە دابەزیوە بۆ سەر پێغەمبەری ئیسلام(صلی الله علیه وسلم)..

بۆیە دەبێ ئێمەش قورئان بخوێنینەوە و لێی ڕامێنین و سوود لەو چیرۆکانە وەربگرین، بۆ ئەوەی ئیلهامی لێ وەربگرین و ڕێگای پرشنگداری پێ بدۆزینەوە..

ئەو ڕێگایەی کە بەرەو ئاشتی و ئەوین و خۆشەویستیمان دەبات.. بەرەو ئەو بیروباوەڕەمان دەبات کە هەموو پێغەمبەرانی بۆ نێردراوە..

ئەم کۆمەڵە چیرۆکە لە قورئانی پیرۆز و تەفسیرە بەناوبانگەکانی قورئان وەرگیراون.. بۆ ئەوەی گرنگی بە بیروباوەڕی منداڵانمان بدەین..





**ناوەندی ڕێنوێن**


07701932749 - 07501269689


hakem1423@yahoo.com
renwen2009@yahoo.com


سلێمانی - بازاڕی ئاوباریک - نهۆمی یەکەم
بەرامبەر کاسۆمۆڵ - دوکانی ژمارە (٦٦)



9 789922 626659